بەرەو موسڵ بەرێکەوت. ئەم دوانە مەبەستی ناسرئەلدەولەیان کردبوو چوونکە لەناردنی باج خۆی دوادەخست و ئەو کۆیلانەی بۆ کاروبارەکان راسپاردبوو کەلای تەوزون هەڵدەهاتن لەکاتێکدا پەیمانیان بەستبوو ناسرئەلدەولە هیچ کام لەسەربازەکانی تەوزون وەرنەگرێت.

کاتێك خەلیفە و تەوزون شاری بەغدادیان بەجێهێشت، نێوەنجیگەران بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد. باوکی جەعفەر کوڕی شێرزاد نێوەنجیگەری کرد و ناسرئەلدەولە بەناردنی باج رازی بوو.

باوکی قاسم کوڕی موکەرەم دەبیری ناسرئەلدەولە، نوێنەری ئەم کارە بوو و کاتێك ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامیگر کرا، موستەکفی و تەوزون بۆ بەغداد گەڕانەوە.

لەحەوتی رەبیع الاوەل/ بیست و نۆی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، موستەکفی، وەزیرەکەی، باوکی فەرەجی سورمەرائی گرت و سێسەد هەزار درهەمی لێ سەند. ئەو چل و دوو رۆژ وەزیر بوو.

